## پێرستی دیوانی میرزا ئەولقادری پاوەیی

## بەناوی خوا

### پێشەکی

ئـەدەبیاتی کـوردی مێژینەیـەکی کـۆن و پـڕ لـە شـانازی هەیـە و کەسـایەتی بـاش و پایەبەرزی تێدا هەڵکەوتوون، کە بە راستی توانیویانە ئەرکی نەتەوایەتی و فەرهـەنگی خۆیان بە جوانی جێبەجی بکەن و لە ژێر ئەو هەموو چەرمەسەری و دەس بەسەریەدا بە بێ وەستان ئەو رەوتەی بگەیێننە بەرەی دوارۆژی خۆیان، بۆ ئەوەی ئێمەش بتوانین جوابی ئەو هەنگاوە جوانانەی ئەوان بدەینەوە، هـەرکام بـە گێـوەرەی توانـا و دەسـەلأتی خۆمان ئەبێ تێکۆشەرێکی دڵسۆز بین، ئەوەیان لە شوێن بەجێماوە و بـە دەسـتی ئێمـە گەیـشتوون بـە ئـامن و زامـن جـەماوەرە و بخرێنـە بـەر دەسـتی هـەموان، تـا لانـی کـەم ئێمەش توانیبێتمان لەو ئەرکە مێژووییەدا خۆمان بە بەرپرس و بەشدار بزانین.

یەکێ لەو کەسایەتیانەی ناوچەی هەورامان میرزا ئـەولقاذری پـاوەیێ، کـە ئەگـەر بێتـو بمانەوێ بەشێوەیەکی تێر و تەسەل لە سەر چۆنیەتی ژیـانی و ئاسـارەکانی بـدرێن ئـەوا کات و زەمانێکی زۆری پێویستە و وادەزانم لێـرەشدا بۆمـان نـاکرێ گەلاڵەی ئـاوا باسـێ دارژێـنین، بـۆ ئـەوەی هـیچ نـەبێ دووجـار دیوانەکـەی لـە چـاپ دراوە و لـە چـەند سەرچاوەیەکی بـاوەڕ پـێکـراویشدا پێناسـە کرابـێ و دووپـات کردنـەوەی ئەوانـەش بـە پێویستی نازانم.

تەنها ئەوەندەی ئەڵێم کـە مـیرزا یـەکێ لـەو شـاعیرە پایەبەرزانـەی شـاری پاوەیـە و لـەو ناوانـــەشدا بـــەرێز و خۆشەویـــستێکی زۆرەوە نـــاوی ئەبـــەن و جێگـــای حورمـــەتی هەمووانیشە، بەس ئێمەش بە کورتەباسێ لە سەر ژیانی و چـەند خـاڵێکی پێویـستی لـە سەر روون کردنـەوەی هەنـدێ لـە ئاسـارەکانی دەخەینـە بەردەسـتی خۆێنـەرانی بـەرێز. بەرابەری ئەو زانیـاری و سەرچاوانەی کـە بـە ئێمـە گەیـشتوون، مـیرزا ئـەولقاذر کـوڕی میرزا موحەممەد، کوڕی کوێخا جـافر، کـوڕی مـیرزا رەسـوڵ، کـوڕی مـیرزا تایـەر، کـوڕی میرزا حەیبەلاّ، کوڕی میرزا فەتحولاّ، کوڕ میرزا ئەحمەد ناسراوە بە کابەڵەد.

میرزا لە ساڵی (١٢٤٠ یا ١٢٦٦ھ ق) لە ماڵەباخی (دەرەزێ) کە بەشێ لە باخاتی پاوە وکە لە باکووری ئەوشارەدایە، چاوی بە دنیا هەڵهێناوە باوکی کە خۆی میرزا و خوێندەوار ئەبێ، هەر بە منداڵی دەیخاتە مەکتەب و لە حوجرەکانی ئەو سەردەمەی شاری پاوە کە مەکۆی خوێندەواری ئەبن پەروەردە ئەبێ و هەر بە منداڵی حەزی لە نووسین و خوێندنەوەی شیعری شاعیرانی پێش خۆی کردوە و هەتا ئەڵێن هەر لەو سەردەمەدا گوڵستانی سەعدی بە ئاوی سوورەتوو نووسیوەتەوە، بە هەرحاڵ پاش ماوەیە دەچێت بۆ گوندی کاشتەر، کە لەوکاتەدا مەڵبەندێکی کەسبی عیلم بووە بۆ خواستیارانی ڕێگای زانیاری. میرزاش ماوەیە لەوێدا ئەمێنێتەوە پاشان لە بەر کۆچی دوایی باوکی و نەبوونی کەسێ کە بتوانێ ئموراتی نێو ماڵیان بەرێوە بەرێ دەست لە خوێندن هەڵدەگرێ و هەر لە سەرەتای لاویەوە ئەبێ بە ژێر باری ئەرکی ژیانەوە، پاش ماوەیە چەرمەسەری و ناتەواوی و دەربەدەری و دەس بەسەری، لە ساڵی (١٣٢٦ یا ١٣٢٥)دا لە شاری کرماشان کۆچی دوایی ئەکا و لە گۆڕستانی ئاغەدا بە خاکی دەسپێرن.

ئەڵبەتە ئەوەی کە دەڵێم ١٢٤٠ یا ١٢٦٦ و ١٣٢٦ یا ١٣٢٥ مامۆستا حەمەعەلی سولتانی لە کتێبی حەدیقەی سوڵتانی جەلدی دووهەم لاپەڕەی ٨٩دا ئەڵێت میرزا لە ساڵی ١٢٤٠هاتوەتە دنیا و لە ساڵی ١٣٢٥دا کۆچی دوایی کردوە، بە پێی هەندێ بەڵگە و بۆچوون ئەتوانین بڵێین ئەو بۆچوونەی مامۆستا سوڵتانیە لە راستی زۆرتر نزیکە.

ئەڵبەتە بۆ کۆچی دوایی میرزا سالأنی (١٣٢٥ و ١٣٢٦ و ١٣٢٧ و ١٣٢٨ ھ ق)شیان داناوە کەچی من لەو ماوەیەدا دوو دەستخەتی کۆنم دەس کەوت کە یەکەم دەستخەتێکی عەبدولأبەگی کوڕی موحەممەدبەگی وەکیلی جوانڕۆ کە لە ساڵی (١٣٢٧ ھ ق)دا نووسرابوو عەبدولأبەگ لەو دەستخەتەدا نووسیویەتی مەرحوومی میرزا ئەولقاڎری پاوەیی، کە ئەو دەستخەتە چەند پارچە شیعری میرزای تێدا بوو کە

یــەکێ لــەو شــیعرانە شــینی موحەممەدبــەگی وەکیلــی جــوانڕۆ بــوو کــە لــە هــیچ سەرچاوەیەکدا تا بە ئەمڕۆ چاپ نەکراوە.

دەست خەتی دووهەم هی میرزا ئەولحسێن پاوەییە کە ئەو تەواوی دەستخەتەکەی شیعری میرزا بوون. ئەویش لە ساڵی (١٣٢٧ هـ ق)دا نووسراوە و لە زۆر شوێندا مەرحوومی میرزا ئەولقادری پاوەیی نوسیوە، بەس دەکرێت بڵێین میرزا پێش ساڵی (١٣٢٧ هـ ق) کۆچی دوایی کردبێ هە تا لە م دوایە دا پارچە شیعریکی میرزام لە جوانرۆ دە ست کە وت ئە گە رچی ناتە واو بوو کە چی لە کوتایی شیعرە کە دا خودی میرزا سالی (١٣٢۴ هـ ق) بو دانانی دە س نیشان کردوە بەم بۆنەیەوە منیش ساڵی (١٣٢۶ هـ ق) بۆ کۆچی دوایی داناوە. بە شێوەیەکی زۆر کورت ئەتوانین بابەتی شیعرەکانی میرزا دیاری بکەین، وەك، سروشتی، وتووێژ، موجادڵە و مونازرە، شینگێڕی، وەرگێڕان، گاز و موناجات، باسی تەریقەتەکان، نامە گۆڕینەوە، هەجوو، سکاڵا و تاریف و پیاهەڵدان، کە هەندێ لەو ئاسارانە لە ڕادەی خۆیدا بێوێنە و ئەتوانین بە شاکارێکی سەردەمی خۆیان دابنێین. وەك: ڕەوڵەت و سەفا، ئاسمان و زەمین، یان میرزام نەمامان، وە یان شەماڵ نامە. بۆ وێنە لە میرزام نەماماندا کاتێ وەرزی پائیز دێت و هەر دار و درەختێ بە ڕەنگێ خۆ دەنوێنێ میرزا ناتوانێ لەو ئاڵوگۆڕەی سرووشتی بێلایەن بێ و دەکەوێتە وتووێژ لە گەڵ دارەکاندا و لێیان ئەپرسێ، ئەم هەموو کالا ڕەنگاوڕەنگەتان لە کوێوە هێناوە،. دووبارە لە زمانی دارەکانەوە دەڵێت: مەگەر نازانی نەوپائیز هاتووە، سوەیل بارخانەی خۆی لە یەمەنەوە هێناوە و بۆ هەرکام کالایەکی کردوە بە دیاری. کاتێ ناوی ئەو کالانە دەبا، هەرکام بە گوێرەی دیاردەی ناوبانگی هەر ولاتێ ئەکا بە دیاری دار و درەختەکان کە ئەو ئاگاداری و ناوبردنی ڕەنگانە کە نزیك بە ٢۴جۆر ناو دەبا بەڕاستی لە ئاستی ئاگاداریەکی بەرزدایە و پلە و پایەی میرزا دەگەیەنێت، ئەم جۆرە بۆچوونانە لە ئاسارەکانی میرزادا زۆر و هەروا لە پێشدا وتمان کە ناکرێ لە سەر هەموویان بدوێین و ئەوە دێڵینەوە بۆ کاتی خۆی.

هەروا کە وتمان تا بە ئەمڕۆ دیوانەکەی میرزا دووجار لـە چـاپ دراوە. جـاری یەکـەم لـە لایەن مامۆستای پایەبەرز و نووسەری کورد موحەممەد ئەمین هەورامانی لە بەغـدا لـە چاپ دراوە، هەرچەند چاپی یەکەمی زۆر ناتەواو بـوو کەچـی مامۆسـتا هـەورامانی بـە لێکدانەوەیەکی جوان و پێناسەیەکی باشـی مـیرزا ئـەو ئـە رکـەی بـە چـی هینـاوە وئـەو هەرمانەی گەیاندوەتە ئەنجام. جاری دووهەمیش لە لایـەن ئەنجومـەنی ئـەدەبی پـاوەوە لە سالأنی ٦٧ و ٦٨دا دەستیان دایە جەماوەری و دووبارەنووسی دیوانی میرزا و پاشـان لە سەر ئەرکی برای بەڕێز کاك هادی سپەنجی لە چاپ درا، ئەگەرچـی ئـەو بەڕێزانـەش لـەو سـەردەمەدا زەحمـەتی زۆریـان کێـشا بـۆ سـەرجەمی شـیعرەکانی مـیرزا، کەچـی بەداخەوە ئەویش بە شێوەیەکی ناتەواو لە چاپ درا.

من بەش بە حالّی خۆم، لەو ماوەیـەدا زۆر گـەڕام بـە شـوێنی شـیعرەکانی مـیرزادا، کـاتێ سـەیرم کـرد هێـشتای زۆرێ لـە شـیعرەکانی مـیرزا ئـەولقاڎر چـاپ نـەکراون و هەنـدێ لەوانەش چاپ بوون ناتەواون، بەم بۆنەیەوە دەستم کرد بە جەماوەری و دووبارەنویسی ناتـەواوی شـیعرەکانی، تائـەوەی لـە گـەڵ مامۆسـتا هـەورامانیدا توانیمـان رۆڵـەت و سەفاکەی لە گەڵ چەند مەنزوومەی چاپ نـەکراوی شاعیرانی دیکـە، بـە نـاوی گـوڵزاری هەروامان لە دوو بەرگـدا بە چاپ بگەیەنین.

پاش ئەوەش من هەر بەردەوام بووم لە سەر جەماوەری شیعرە چاپ نەکراوەکانی میرزا، ئەگەرچی وا دەزانم هێشتای زۆریان دەسـتم نەکـەوتوون، بـەلأم لـەو ماوەیـەدا زیـاتر لـە ١٧٠٠دێڕم دەست کەوت کە لەو دوو دیوانە چاپ کراوەکانیدا نـەبوون، بـەم بۆنەیـەوە هاتمە سەری ئەو باوەڕەی کە دەبێ بۆ جاری سێهەم ئامادەی چاپیان بکەم. جیـا لـە ئـەو سەرچاوانەش کە باسمان کردن، چەند دەستخەتێکی کەم دەست کەوت کە سیانیان زۆر کۆن و جێگای باوەڕیش بوون، یەکەم دەستخەتێك بە ناوی میرزا (عبدالمصمد) ئەفوایی کـە لـە هـۆزی مـستۆفیەکانی پـاوە و لـە سـالّی (١٣٤٥ه ق)دا نووسـیویە و زۆری لـە شیعرەکانی میرزای تێدایە.

دووهەم دەستخەتێکی عەودلأبەگی کوڕی موحەممەدبەگی وەکیلی جوانڕۆ، کە ئـەویش لە ساڵی (١٣٢٧ ﻫ ق)د ا نووسیویەتی زۆربەی ئەو شیعرانەش هی میرزا بوون. سێهەم دەستخەتێکی میرزا ئەولحسێن کە هەندێ دەیانگوت لە بنەماڵەی مـیرزا بـووە، ئـەویش لـە سـاڵی (١٣٢٧ ﻫ ق)دا نووسـیویەتی و بـە تـەواوی شـیعری میرزایـە و لـە زۆربـەی شیعرەکانیشدا مەرحوومی میرزای نوسیوە.

هەندێ دەستخەتی کەی وەك دەستخەتی کاك عەباس لوتفی و ئاغەی نەقشبەندی و کـاك حەمـەی خالـدیمـەکی، کـاك ئـەنوەری مـستۆفی و چـەند بـەیازی کـۆن، کـەناوی نووسـەرەکانیان نـەمابوو. یـەکێتر لـەو دەسـتخەتانـەی کـە لـەم دوایـەدا دەسـتم کـەوت دەستخەتێ بوو کە لە لای کاك سەید مورتەزای نەچراك کـە ئـەویش هـی مـەرحوومی باوك بوو کە لە کـاتی خۆیـدا لـوتفڵلأی بـارامی بـۆی نووسـیبو و پێـشکەشی کردبـوو بـە سەید موحەمەدی نەچراك کـە هـەموویان شـیعری مـیرزا ئـەولقاذری پـاوەیی بـوون. بـە سپاسـێکی تـەواو برایـان بـۆ ئـەو بەڕێزانـە بـە تایبـەت کـاك مورتـەزا نەچـراك. ئـەم شیعرانەی میرزام جەماوری و دووبار نووسی کردوونەتەوە هیوادارم بکەونە بەر دەستی هەموان.

هەروا لە گەڵ نووسینی شیعرەکانا هەندێ خاڵم خستونەتە بـەر دەسـتی خوێنـەران، بـە پێویستی ئەزانم لێرەشدا بە شێوەیەکی گشتی ئەوەی بڵێم هەندێ لەو شیعرانە لـە بـەر نەبوونی دەستخەتێکیکە و لە ناوچوونی دەستخەتـەکان بـۆم نەخوێنراونەتـەوە و لـە جێگایاندا نوختەچین یان خاڵم داناوە. بۆ هەندێکیتریشیان لە بەر ناتەواوی بە جوانی بۆم روون نەبونەتـەوە کـە هـی مـیرزان یـان نـا، تـەنها ئەوەنـدە پـاش پارچـەیەکی مـیرزا هاتوون و نووسراوە و (لەهوئەیزەن) بەو بۆنەیەوە منیش نووسیونمەتەوە یان پارچـەی (فەڵـەك خـامۆش کـەرد) و (مـیرزام خـەیلێوەن) لـە گـەڵ یـەکدا تێکـەڵ بـوون دێـڕی زۆریشیان دووپات کراونەتەوە وەك:

ماچان شا عومەر تەمام ناوەشەن　　　　دوربای ئازارش خەیلێ سەرکەشەن

یان:

خۆ شەرەفالملك هەر ها جەماڵت          وە سۆز مەپەرسۆ حاڵ و ئەحواڵت

زۆر شتی ئاوا دووپات کراونەتەوە، لە سەر ئەو باوەڕەش نیم کە میرزا ئەوانەی لەو شیعرانەدا دووپات کردبێتەوە منیش لە بەر ئەوەی نوسخەیەکی وام دەست نەکەوت کە ئەوانەی بە جیا نوسیبێ هەر وەك خۆیان نوسیونمەتەوە، بەڵکو رۆژێ بێتە پێشێ کە هەرمانی لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەیان لە سەر بکرێت و بکەونە بەردەستی هەموان یەکێتر لەو خاڵانەی کە پێویستە لێرەدا بوترێ پارچە شیعرێکە کە لە دیوانەکەی کاك هادیدا بە ناوی (فەڵەك باری دەرد......          تا کەی بکێشۆ جەفای بار دەرد)

کە بە ناوی میرزا ئەولقاڎرەوە نووسراوە کەچی لە دەستخەتێکی کۆندا کە لە ساڵی (١٢٨٢)دا لە لایەن لوتفوڵلا ناوێکەوە نووسراوە بە ناوی میرزا شەفێع نووسراوەتەوە. ئەوەش دو دێڕی کۆتایی ئەو پارچەیە تاکو باش روون بێتەوە:

با جەتی نووری شای خەیرالبەشەر          بە بەخشەم بە شەرم شەفیع مەحشەر

تاکەی جەور دەرد بڎۆ ئازارم          نامم شەفیعەن سەڎ شەرمەسارم

بۆ ئەوەی رووناکبیران و لێکۆڵەران باشتر بتوانن بۆچوون و ڕای خۆیان لە مەڕ ئەو شیعرە دەربڕن، کە هی کامیانە، ئەوا ئەوەی دەستخەتەکەش هەر وەك خۆی لەم دیوانەدا دەنووسینەوە، ئەگەر بۆمان کرا وێنەیشی لە کۆتایی کتێبەکەدا دێنین.

یەکێتر لەو شتانەی کە لێرەدا ئەبێ بووترێ، لە سەر، دەم و نفووس پاکی و هێنەی میرزایە، وای دەگێڕنەوە لە کاتی خۆیدا کابرایەکی ئەهلی حەق دوو ژنی دەبێ و لە هیچ کامیان منداڵی نابێ، ئەو سەردەمەش ناوبانگی شێخانی پاوە لە زۆربەی ناوچەکاندا بلاو ئەبێتەوە، کە دەم و نفووسیان چەندە پاکە و دۆعاشیان گیرایە، ئەو کابرایەش لە گەڵ هەردوو ژنەکانیدا، روو دەکەنە شاری پاوە و دەچنە خزمەتی شێخ، شێخیش کە لە باری ئاینیەو، زۆر پابەند ئەبێ هەرچی دەکا ناتوانی دۆعا بۆ ئەو کابرایە بنوسێ، رەوانەی لای یەکێ لە مامۆستایانی پاوەی دەکات، مامۆستاکەش هەر وەك شێخ بیر ئەکاتەوە و

ڕەوانەی لای میرزا ئەولقاڎری دەکات، میرزاش کاتێ سەیری ئەو کابرایە دەکا لە گەڵ ئەو دوو ژنەیدا بەو شێوەیە دەس بە دەستی پێ ئەکەن، دڵ و دەروونی دێتە کوڵ و لە ناخی دەروونــەوە لــە خــوای خــۆی دەپاڕێتــەوە و پاشــان ئــەم دوو دێــڕە شــیعرەش لــە رووی کاغەزێکا بۆیان دەنووسێ:

| | |
|---|---|
| یـا پـیر بـاوا سـەید مـاڵ جـە بێـدۆ بـەڕ | ئامــــا ئاســــانەت یەکانــــەو دوو دەڕ |
| نـــە دەور بارەگــات مەکـــەران هۆڵـــە | پێـــشیان عـــەتا کـــەر جـــووتێ پارکۆڵـــە |

پاشان ئەڵێت بچنە سەر ئەو پیرە و سێجار لـە دەوری بارەگاکەیـدا بگـەڕێن و لـە خـوای گەورە بپاڕێنەوە ئیشائەڵا خوا ڕەحمی خێرتان پێدەکات.

ئەڵبـەت بـە چـەند شـێوە ئـەو شـێعرەیان دەگێڕایـەوە وەك (یـا پـیر یـاوا سـەید، یـا پـیر ئیمساعیل، یا پیر باوا شێخ، وە یا باوا گوڕگوڕ) کە کاك حەمەڕەشی حسامی فـەرموویان (یا پیر باوا سەید) درووستە کە مەبەست پیرەکانی ئەهلی حەق دەگرێتەوە.

ئیرادەی خودا وەها دەبێ لە ماوەی یەك ساڵدا ئـەو دوو ژنـە زکیـان پـڕ دەبـێو هـەرکام ئەبنە خاوەنی کوڕێ ئەو کابرایەش بۆ رێز گرتن لە میرزا دووباری (قاتر) گـەنم و نـۆك لە گەڵ خۆی دێنی و دێن بۆ ماڵی میرزا، مامۆستایانی پاوەش لەو هەرمانە سەریان سـوڕ دەمێنێ و لە میرزا چۆنیەتی نووسـینی ئـەو دۆعایـە لـێپرسـیار ئەکـەن مـیرزاش خـودی دۆعاکـە دەبـا و دەڵێـت خۆتـان بیکەنـەوە، کـاتێ دوعاکـە دەکەنـەوە دەزانـن تـەنها ئـەو دودێڕە شیعرەی لە سەر نووسراوە،

ئەوانیش زیاتر ڕێـزی مـیرزا دەگـرن و داوای لێبوردنیـشی لـێدەکـەن دەڵـێن ئەگـەر خـوا مەرحەمەتی لە گەڵ بەندەگانی خۆی هەبێ هێنەی شێعریش پەسەند ئەکا، ئـەم جـۆرە بەسەرهاتانە لە ژیـانی مـیرزادا زۆر بـوون کـە لێـرەدا نـاکرێ هـەمووی ئەوانـە بنووسـین هیوادارم ڕۆژی بتوانین تەواوی ژیانامەکەی میرزاش بنووسینەوە.

لە کۆتایی دا پێویستە ئەوەش بڵێم کە میرزا بە ئاواتی ئەوەی بووە کاتی مەرگی لە زەید و ماواکەی خۆیدا بە خاکی بنێژن، وەك ئەو چەند دێڕەی کە لە پارچەی وزباشی دەخیلدا دەڵێت:

سەڎ کەس جەی مەسکەن ئاسوودە حاڵەن (مەرفوع القلم) فاروغ البالەن
منیچ سەڎ و یەك مەحسوب بڎاران پەرێم خاستەرەن جە لوای شاران

و یان:

وەی زوخاو سەرد با فەرار نەکەم ویم نە قاپیتان شەرمەسار نەکەم
رای جۆڵی تەقدیر وە قەریب نەکەم جەستەکەی خەستەم گۆڕ غەریب نەکەم

میرزا هەر وەك لەم چەند دێڕەدا دەری ئەخات لە ژیانیدا تووشی چەرمەسەری و بێمەیلی و دەربەدەری زۆر بووە، بۆمان دەرئەکەوێت کە بارەها لە پاوە دەرچووە لە بەر گوشار و دەردیسەری ژیان، ئەو شارەی بەجێ هێڵاوە کە لە شیعری بێگاری و هاواردا بەشێتر لەم ئازارانەمان بۆ ئەدرکێنێ تەنها تاوانی خاوەن قەڵەم بوونی بووە، وەك لەو دێڕەی کۆتاییدا دەر ئەکەوێ، چەندە بە ئاواتی ئەوەی بووە کە هەتا لاشەکەیشی پاش مەرگی لە زەید و ماواکەی خۆیدا بە خاك بسپێردرێت کەچی ئەو ئاواتەیشی ناتوەتە دی و هەروا کە وتمان پاش مەرگی لە گۆڕستانی ئاغە لە شاری کرماشان بە خاك دەسپێردرێت کە بەداخەوە ئێستاش ئاسارێ لە گۆڕەکەی نەماوە، با تەوەجوو بەوەش کە دەڵێن لە کاتی خۆیدا مەرحوومی حاجی ئەحمەدی موختاری کە پاوەیی دانیشتووی کرماشان بوو، گۆڕەکەی گواستوەتەوە کەچی ئێستاش نازانین لە کوێدایە .

حەمەڕەشی ئەمینی ٨٥/٨/١٥

## ئازیز نەپەرسای

ئازیز نەپەرسای جارێ جە حاڵم
سەبرت سۆچنان یانەی خەیاڵم

سارای دەشت دڵ بەرشیەن جە دەس
مەزرەعەی شادیم کەردەن وە قەفنەس

دووخان دووکەڵ هەناسەی سەردەم
کەردەن وە زخواڵ مەجموعەی فەردم

چوون کۆرەی ئایر مەخێزو کۆ کۆ
یانێ یە راسەن نیاوان وە تۆ

فەراقت فەرقم پارە پارە کەرد
نەفەس جە قەفەس تەن ئاوارە کەرد

فڎای دوریت بام جەمین جام جەم
دوری تۆ بیەن بەردەسیلەی خەم

بێ چەخماخە و برق بێ بادوو باران
مەڎەی لێم وێنەی رەعد وەهاران

تاقەت بیوە هوون ماتڵ بی وە ئاو
تك تك چەنی هەرس زخواو و سەیلاو

رێزا وە دامان دیسان هەم جە نۆ
تووخوا سا ڕاسەن نیاوان وە تۆ

یانە وێران بام ئەر نیاوا بۆ
مەبۆ مەنزوورت هەر وە داوا بۆ

فەرەنگی سوڵحش چەنی ئیسلام کەرد
رەهگوزەر رۆم جە عرووس ویەرد

کۆتا بی ئاشووب شاهان سەروەر
دریا تەساڵەی جەنگ هەفت لەشکەر

قاتڵ جە مەقتووڵ یەکسەر بیەن رازی
بڕیا عەداوەت ماجەرای مازی

دنیا گشت تەمام سازیان وە هەم
قار و قین جە لای تۆ هەر نەوی کەم

فایدەم جە لات مەردە مەردەن بۆ
کۆچ خێڵ ئەو خوار لەحد کەردەن بۆ

تۆ بێبەلاً بای من کەردم بە وێم
بادا کە هەرچی مەیۆ بەیۆ پێم

مەزانوون دۆزەخ هەر پەی من تاوەن
چی وەرتەر عەزا و چا هەم عەزاوەن

لە رووی دەستخەتی (ئەفوایی) نووسراوەتەوە لە سەرەتاوە نووسراوە (میرزا عبدالقاڎر)

### ئازیزم ئێشان

ئازیزم ئێشان ئازیزم ئێشان      دووربای دیارەن دیدەکەت ئێشان
سەوگەند وە بارگەی مەولای دەروێشان      شیم نە واڎەی وەخت نەزع گیان کێشان
خەفەت خەم مەینەت سەر دا نەجەرگم      گشت مدرا تا بەی ئەجەڵ پەی مەرگم
هەی هاوار هەی داد هەی هانا هەی رۆ      پەی چێش ئێش ئامانە نەتۆی دیدەی تۆ
هەر ئێشێ ئامان ئامان نە دیدەت      با بەی پەی دیدەی قەیس خەم دیدەت
سەر تا پای بالأم پڕ ئێش و نێشەن      ئەو ئێش تیەش نەشۆ مەسرەفش چێشەن
سا جە  دیدەی وێت توخوا لاش دەرە      پەی لای دیدەی من رەوانەش کەرە
دیدەی تۆ نێشۆ مەستوو خومارەن      دیدەی من ئێشو سۆمایش تارەن
قبوڵ بۆ جە لای شای کەرەم بێشۆ      وە دیدەی من شۆ ئێش دیدەی تۆ
ئازیز سەودای بەین دڵداران پاسەن      ئێش دیدەی دۆس پەی دۆسان خاسەن
نەك رەقیب شاڎ بۆ وە ئێش دیدەت      مەست بۆ جەو بادەی کەس نەچەشیدەت
خەیر با غەیر مەحرەم هەر نامراد بۆ      دۆس بە وەسڵ ئێش دیدەی دۆس شادبۆ
یا شا جە دیدەی تۆ رەوانە بۆ      جە بانی دیدەی من با تانە بۆ
شادی مەویاروون هەی بەرگوزیدەم      ئێش دیدەی تۆ بگنۆ وە دیدەم
قاڎر چوون دیدەی لەیلش پڕ ئێشەن      نوور بینای دیدەش پەی چێشەن

**لە ئاخری ئەم پارچەیەدا ئاوا نووسراوە:**

تمت شد در حالت انفجار کثرت ملالت و افسردگي آه من الموت و حالات في ٢٥ شوال ١٣٤٥ عبد الصمد

(ئەفوایی)

### ئازیزم زەردەن

ئازیزم زەردەن ئازیزم زەردەن      راسەن کاغەزم وەی رەنگە زەردەن
قەسەم هەر بەو کەس بێهەمتای فەردەن      جە رەنگ زەردی من نمونەش بەردەن
زەردیم زەردی رووی مەجنوونەکەی تۆن      زەردی ئێڎ کامەن زایفیش جە کۆن

شێوەی روخسارم هەر ئەوەند زەردەن     گرەو جە زەردی زەعفەران بەردەن
سەرتاپام تەمام ئالوودەی دەردەن     باغات شادیم خەزانش کەردەن
کاغەز کەی چوون رەنگ شێوەی من پێشەن     من زەردم ماچان زەردی ئەو چێشەن
یە زەڕەی هەواڵ زەردی من فامان     پەوکی روزەردی یاران پێش ئامان
ئەر یەك رۆ چوون من نەونەمامی نۆ     بکێشۆ جەفای دەرد دووری تۆ
سەهلەن روو زەردی سیاهی چارە     وە مەرگت قەسەم مەبۆ سەد پارە
بارێ هەی ئازیز دڵ پەسەندیدەم     رەوشەنی دیدەی رەمەق رەمیدەم
ئەر پەرسی عومرم چەنی ویاران     (بە وێنەی) ئەحواڵ مەردەی مەزاران
دڵ چەنی زامان هەر جۆش مەدا جۆش     نەوینی بە چەم نەشنەوی وە گۆش
تەپو دووی دووکەڵ دوخان دەردم     کزەی دەمەی وشك هەناسەی سەردەم
پۆشان دەشت و دەر هەوارگەی دەرون     نادیار کەردەن دڵەی پڕ جە هون
مەر هەر یاد تۆ ئەی ئاوات وەستەم     بزانو جە کۆن دڵەی دەر بەستەم
بەیۆ چون شەماڵ رۆحئەفزای کاوان     یا خۆ چون نەسیم لەب روی شەتاوان
وێش دۆ بەو دەربەند سیای جەنگەڵدا     بەو رەشماڵ تاڵ چاڵ دوکەڵدا
جە نۆ یانەی دڵ دیسان چەنی هەم     جاڕ و دۆجارێ دوخانەکەی خەم
وەرنە تا مەحشەر دڵ ئاهش سەردەن     نادیار دەم دوخانەی دەردەن
فدای یاد ت بام سا کون کەی تاکەی     دڵ مەبۆ وە گەرد تا یاد تۆ بەی
یادم کەر وە یاد ویەردەی جاران     وە یاد بەینەت شەرت و شۆن داران
ئەر سەد کەوە یاد قەدیمت شادم     دیسان با نەشۆ یاد ت جە یادم
سەلاح هەر ئێدەن وە یادم باری     یاد ت یارم بۆ پەی یادگاری
ئەر یاد ت ببۆ نەونەمام نۆ     ئەی هوو خەیلەوەن هام وە یاد تۆ
شەوان تا وەڕۆ یادم جە لاتەن     دەك وە رەحمەت بۆ مەعدومی واتەن
چە حاجە تەن دەس پەی قە ڵەم بەر     یادم نمە شۆچەنیت یاد کە رون

لە رووی دەستخەتی کاك عەباس لوتفی نووسراوەتەوە.

## ئاغە چوون شاعیر

ئاغە چوون شاعیر هەر وەك ئەلبورزە     ئەهلی دنیا گشت مایل وە گورزە
دەرونم بۆ زەم گشتی شپرزە     خوداوەند ئاخر گونا ئامورزە

ریا بۆ شاعیر مەسرەفی نییە     عەرزەی بێ عورزە فایدەی چییە
فەردم بوو بە دەرد بەیتم گشت وە مەیت     تا وە خەیر کەمێ هەڵگرم لە زەیت
بە خوا هەر وەك تەیر دانە و دامەکەم     وا چاوم لار بوو بۆ ئەنعامەکەم
تۆ خۆ بە تاقی سەنەد ت داگە     یەقین خەتی خۆت لە بیر نەماگە
سەرداریت بۆم کرد وە تاقەی مەقبوڵ     تاقەت هەم دیسان قەرار داوە پوڵ
پوڵ هەم بە وادە ئەویچ هەم خەلاف     خەلاف هەم وە پووش مایەی چەترباف
بە خوا بۆ فەقیر تەن نادیاری     جواو خۆشترە تا ئینتزاری
تۆ تا گمێزت دیسان بگرێ کەف     من نەعشم ئەوەن بۆ سەحرای نەجەف
خۆ تۆ لە گرەو بەر لە حاتەم بووگی     ئیستە وا کەم کەم درۆزن بووگی
وەك بەعزێ ئەشخاس چووکە چووك مەکە     گەورەی ولاتی خۆت بچووك مەکە
ئەوەند فەقیران خەستە و خار مەکە     شاعیران لە خۆت دڵ ئازار مەکە
ئەر کەرەم ئەکەی قین و قار مەکە     ئەر ناکەی هەم کەس تەماذار مەکە
وادەخەلافی باوی تۆ نییە     تۆ مەردی نامەرد ناوی تۆ نییە
من سەلاحەتم وەها کرد قبوڵ     یا تۆپێ تاقە یا شەش قەران پوڵ
ئیمڕۆژ بینێرە هەر کام مەیلت هەس     با مەرامەکەت دەر نەچێ لە دەس
یا خۆ جواوێ ئانترە لە گشت     وە شەرتێ ئەلئان بکەریم وە مشت
قاذر تاقەتی گەییگە تاقەت     من ئاسوودە حاڵ تۆ هەر فەراقەت

لێفەشڕ

ئاغە دەردی دڵ بێنەهایەتە     حیکایەت نیەن یە شیکایەن
تۆ حەکیم حاڵ من ساحێب دەردم     گۆش و هۆش و دڵ بدەر وە فەردم
جە ماڵ دنیا لەحافی دارون     دایم زیندەگی وە ئەو مەویارون

لەحاف کام لەحاف جای حەسیر بافان
کۆنەی کوڵ عەدەم پەند لەحافان

نیشانەی نیگبەت مەنزڵگەی ئیدبار
جای کێچ و مەگەس لانەی موور و مار

تەوق لەعنەت تەرز ناپەسەندیدە
باڵاپۆش جن شەیتان خەندیدە

رێزە رێزەن و شڕۆڵ و فەرتوت
تەنکتەرەن جە تای تار عەنکەبووت

سەربار مەینەت یاگەی بەڵا و دەرد
سەردتەر جە هەوای ئێلاخان سەرد

نە تانش مەندەن نە پۆش دیارەن
ئازای ئەنامش فەتار فەتارەن

هەرکەسێ یەك شەو بدۆش بە وێدا
تا رۆی قیامەت هەر ها نە جێدا

بدان وە جەرگت حەربەی خارابڕ
وەشتەرەن جە خاو خوفتەی لێفە شڕ

بەڵێ ئاغەکەم دانای سوخەن سەنج
کان کۆی گەوهەر مەعدەن سەرای گەنج

ئەر پەرسی جە کۆ؟ پەی کێ ورازیان؟
ئەسڵ بنیادش پەی کێ سازیان ؟

ئەوڕۆ کە ئادەم شای (ابوالبشر)
ئاما بە وجوود نە عەرسەی خەتەر

وە ئەمر بێچوون پادشای مەعبود
نە پاڵوی چەپش حەوا بی مەوجود

جە دمای حیلەی ئیبلیسی بەدکار
گەنم داوە خورد حەوای مەینەتبار

ئادەمیچ وە قەوڵ حەوا دڵوەش کەرد
چون حەوا دانەی گەنم لەبچەش کەرد

ناگا خوداوەند رەنجیا لێشان
سزای قیامەت نمانا پێشان

هەردوو مەحروم بین جە رەوزەی بەهەشت
غوباری عوسیان وە باڵاشان وەشت

وە حوکم فەرمان پادشای بێچوون
نائومید کەوتەن وەرووی دنیای دوون

حەوا حەواڵەی خاك جەددە کەرد
ئادەم تەشریفش وە (سەرانديب) بەرد

دووسەد ساڵ تەمام شین و زاریشان
ویەرد جە گەردون ئاهی کاریشان

تا ئاخر ئادەم وە دڵ تۆبە کەرد
تۆبەش قبوڵ کەرد زا ت تەنیای فەرد

جە کۆی عەرەفات بێ زیاد و کەم
وە چەند شادی و زەوق تا یاوان وە هەم

ئەمجار دەس پەی کار عەمارەت بەردەن
مەنزڵێ شیرین ئامادە کەردن

بەلام چوون یاتاخ نادرەی نایاب
خاڵی بی جە فەرش جە باقی ئەسباب

حەوا چەنی خەم خەیاڵ پڕ دەرد
کێشا نە دەرون هەناسان سەرد

ناگا جبرەئیل ئاما وە لاشان
قەرار دا ئەسباب ئەوزاع جاشان

جە بەهەشت بەعزێ پەنبەش پەی ئاوەرد
چەنی یەك دووکێ چوون چەرخی چەپگەرد

واتــش برێــسەش ســەوڵی سۆســەن بــۆ     یـە مایـەی فەرشـەن ئـاوردم پـەی تـۆ
حــەوا دوك ئــاوەرد نیــاش وەلای پێــڵ     چەرخش دا وە چەرخ چوون چەرخ چەپگێڵ
وە ریــشەی مەینــەت دووكاویــچی خــەم     تای خـاو تـەناف دووبـاد كـەرد وە هـەم
وە پەنبــەی پرچــەور هیجــران یــاران     هـۆر كـەرد گرۆڵـێ تاقمـەی پـەژاران
ئــەو ئۆســای ســیمساز وە شــۆماڵ دەرد     وە نیـشانەی خـەم شـۆماڵ كـاری كـەرد
كێـشا نــەڕووی دار مەوڵەقــەی جــەلیل     پـا كـەرد نەپاچـاڵ پاتیتـەی عـەجیل
وە لوولــەی فــیراق مــەكۆی مــەهجوری     گـــەردش دا وە دەف دڵانـــەی دووری
تــەمام بــی بــڕیش وە مــەودای خــەیاڵ     رەنگـش كـەرد وە دووی هەناسـان كـاڵ
كــەردش وە لــەحاف سازناش وە هــەم     پـەی عـەیش حـەزرەت جـەناب ئـادەم
غـــەرەز ئـــەو بابـــا (علیـــەالـــسلام)     وە مـوددەی حـەیات هـەزار ساڵ تـەمام
گانــە تــۆی یاتــاخ گــا هــەم جــە ســارا     چـــەنی لێفـــە شـــڕ دنیـــاش ویـــارا
جـە ناگـا جورعـەی جام ئەجـەڵ وەرد     رۆحش وە رەوزەی ریـزوان تەشـریف بـەرد
جـەو دمـا لـەحاف مـیراس خـۆش خـەو     وەجامەنـــد پـــەرێ ئـــەولادان ئـــەو
(یونس) و (یونـە)، (هـاروون و هابیـل)     (قـاروون) و شـەمعێ)، (زەكـاوە قابیـل)
هەر یەكێ دەورێ پـەرێ وێش بـەردش     هـەركام مـوددەتێ خـاو تیـشدا كـەردش
جە دمای ئەوزاع مەدرەسە و تەدریس     جـە دەوران دوور یـاوا وەلای (شـەیس)
ئەویچ هەم (قابض) كـەردش (قبض) رۆح     لێفەشـــڕ یـــاوا وە جـــەناب (نـــۆح)
جـە وادەی تۆفـان بـەحر بـێ ئەنـدێش     نیاش وە كەشتی بـەردش چـەنی وێـش
پادشــای شــاهان تــاك تــەنیای فــەرد     كەشتی جەدەریای تۆفان خەلاس كـەرد
بــەلاّم تــاعونی نــازڵ كــەرد لێــشان     بێـزار بـین جـە گیـان زنـدەگی وێـشان
بغەیر جە (یافس) سیوای (سام و حام)     فانی بین تـەمام زومـرەی خـاس و عـام
وەختێ تـەمام بـی وادەی رجـا و خـۆف     دنیـا خـەلاس بـی جـە تۆفـان تـۆف
(سـام و حـام) ج نـۆ لێفەشـڕ بـەردەن     هـەنی شـەریكی (یـافس) نەكـەردەن
تاكـە دوسـەد سـاڵ هـەر جـە لاشـان بـی     ئـەو بـەرگی شـەو خـاو سـەر تاپاشـان بـی
ئــەوانیچ هــەم شــین وە مــاوای عــەدەم     مەند هەر لێفە شڕ خاسەی خۆش قەدەم
تا كەی دنیای دوون تیپ تیپ و جوق جوق     مـەعمور بـی دیـسان جـە گـرۆی مـەخلوق

چین چین لێفە شڕ بەردەن وە تاقی ‌  ئەوان دەس دەس شین ئێدٚ هەر مەن باقی

عەرزەی (مختصر) تەرز رەحمەتەن ‌  عەرزەی (مطول) مایەی زەحمەتەن

هەرکەسێ دەورێ پەرێ وێش بەردش ‌  هەر کام مودەتێ خاو تیشدا کەردش

جە عەسرە ئادەم تا حاڵی تەحریر ‌  وەی تەورە بەندە کەردەنم تەقریر

ئەو لێفە خاسە پاو قدووم خەیرە ‌  ئەو پەڕ قوی قەشەنگ خۆش سەفا و سەیرە

دەس ئەو، دەس ئامان باوان وە باوان ‌  ئینە چل ساڵەن وەلای من یاوان

مەناڵۆ وە دەرد جەفای وێشەوە ‌  تۆز ماڵ نۆح هەر ها پێشەوە

ئیمشەو کەفتەبێ وەلای جێمەدا ‌  دەسم بەرد بدٚەوش وە روی وێمەدا

دەنگێ لێش ئاما پەشێو بی هۆشم ‌  سەدای شیرینش ئاما نە گۆشم

واتش مروەتەن بۆ ئازادم کەر ‌  وە سەر ئازادی خاتر شادم کەر

دەرونم رێزەی سەر مەودای خارەن ‌  سەرتاپام تەمام فەتار فەتارەن

واتم من خاتر وەکێ شاد کەرون ‌  نەدارون قودرەت تۆ ئازاد کەرون

مەگەر ئەو شەخسە بوزۆرگەوارەن ‌  چوون جەناب شێخ نە عام دیارەن

ئازادت کەرو نە عەرسەی خەتەر ‌  سەر ئازاد مەبۆ تا (یوم‌المحشر)

وەرنە تا ئەو رۆ مەحشەر مەبۆ جەم ‌  مەگێڵی چەنی ئەولاد ئادەم

قادر تا زیندەی رووی رۆزگارەن ‌  دۆعاگۆی ئاغەی بوزۆرگەوارەن

لە روی دەستخەتەکەی میرزا عبدالحسین ١٣٢٧ هـ ق

### ئاغەی مستۆفی(١)

ئاغەی مستۆفی مونشی دیوانان ‌  سەدر سەفنشین ئەجلاس خانان

دانای دووڕشکاف نادرەی ئەیام ‌  سەردار عەشرەت سپای خاسوو عام

رای تەخت عیرفان تەمام تەی کەردە ‌  پەی وە سەر مەنزڵ خەیاڵات بەردە

حەکیم ئازار گرۆی سەرداران ‌  دەوابەخش دەرد خاتر پڕخاران

ئوستاد حکمەت دەرس جالێنووس ‌  سەرمەشق ئاداب فردەوسی جە تووس

زەڕاب زەڕسەنج زەڕابخانەی هۆش    دەریای کەمالأت بەحر جەیحوون جۆش
پەنای فەقیران بیٚنەوا و دەرویٚش    ئومیٚد عالەم گشت بیٚگانە و خویٚش
بەخشەندەی بیٚباك میرحاتەم تەور    باش بالأدەس بزورگان دەور
خۆ من غەیر جە تۆ کەسیٚ نەذاروون    دایم لوتف تۆ وە چەم مەذاروون
جەسارەت نەبۆ دیسان هەم جەنۆ    بەندە عەرزم هەن وە خاك پای تۆ
هەر تۆنی سەبەب زندەگانی من    سەرمایەی شادی و کامەرانی من
نانم جە ئاداب سفەرە و بەخت تۆن    نگین بەختم جە پاتەخت تۆن
تەعامم نعمەت دەوڵەتخانەی تۆن    بەساتم هیمەت خەسرەوانەی تۆن
زەوقم جە زینەت بەزم بادەی تۆن    شەوقم جە شەوکەت خوذادادەی تۆن
جە ئەنگوشت پا تا وە فەرق سەر    گشت هەر عەتای تۆن وە دانای داوەر
رەسم پاییز و زووسانەم بەردەن    شوکرانەی لوتفت وەجا ئاوردەن
مەبۆ مەعروز بام چوونکە ناچارم    مونتەزر خەڵات فەسڵ وەهارم
بالأپۆشەکەم شڕبیەن چوون ویٚم    ویٚنەی نامەردان خەندەش مەیۆ پیٚم
تۆ ویٚت بزانە کەسیٚ ئەر بۆ کەس    غەیر جە خوذا و تۆ نیەن فەریادرەس
مەبۆ هەر پەنا وە تۆ باوەروون    داد فەقیریم جە لای تۆ کەروون
چوون وە تۆ بەندەن دایم وجوودم    بەخوا هەر وە تۆن بوود و نەبوودم
ئەر چووم هەن جە لات مائیوسم نەکەی    مەحروم خزمەت مائیوسم نەکەی
سەردار نیمداشت بالأپۆش ویٚت    ساترەی بەدەن حفز دۆش ویٚت
بکیانە پەریٚم شای کەرەمداران    بزورگی کەری چوون بزورگ واران
وەختەن هەم جە لای شای کەرەم بیٚشۆ    داران گشت خەڵات بە پۆشان جە نۆ
هەم چەنی داران وە یەك ئەندازە    منیچ بپۆشوون خەڵات تازە

سـار ئـەر مایـەی عـومر نـەبۆ پایمـاڵ — هــەتا کافیــەن تاکــە دووســێ ســاڵ

یـا شاه تـا فەڵـەك بـێستوون بەنـدەن — تا زەمین نـە پـشت گاو ماهی مەنـدەن

تـا دنیـا وەیتـەور لـەیل و نـەهار بـۆ — ئاغــەی مــستۆفی هــەر پایــدار بــۆ

ڕۆ جـە ڕۆ فیـشتەر بوڵەنـد ئیقبـاڵ بـۆ — عــومرش زیــاتر جــە عــومر زاڵ بــۆ

قاڎر تا زیندەن هەر دۆعاگۆش بۆ — هەر ساڵ مونتەزر خەڵاَت نۆش بۆ

[١])میرزا ئەم پارچەشیعرەی بۆ میرزا حەیبەڵاَی مستوفی نوسیوه.

## ئاهوی سەریاسان

ئـاهوی سەریاســان ئـاهوی سەریاســان — ئــەی ســەردار ســان ســپای خاڵخاســان

ئەی مودەبر موشك شای مـودبر ناسان — ئـەی غەزاڵـەی چین ئـاهوی سەریاسان

ئــەی نۆبــەر نــەمام نۆڕەســیدەی نــۆ — واچـە مـن جـە کـۆ دووری تـۆ جـە کـۆ

ئــەی جــەیران ئاســای شــوخ نەساســڵ — ئــەی نــیمنگــای نــاز دەوای دەرد دڵ

ئـەی شـفای زامـان جەسـتەی خەسـتەی مـن — ئــەی دەرمــان زام مــارانگەســتەی مــن

ئــەی لــەیلی دەمــاخ بــاڵاَ زەڕ ســتوون — ئەی مایـەی مەینـەت مـەجنوونی مـەجنون

ئــەی تەرســانژاد شــۆخ بــێپــەردە — ئەی شێخ سـەنعان جـە دیـن بەرکـەردە

ئەم پارچە شیعرە لە دەستخەتی موحەممەدی خالدیەکی پاش شیعری قیبلەم قار وەسێن نووسرابو هی میرزا ئەولقاڎری پاوەیی ناتەواویشی بـوو لـە وتـەی میرزاشـەوە نزیکە بۆیە لێرەدا نووسیمەوە.

## زەمی ئە و ڕە حمان

ئەوڕەحمانەکــــەی گوودەرمانەکــــە — ڕەوگەوانەکــــەی هــــیچ نەزانەکــــە

کــــەری مــــاقووڵی غــــەفوور زلانــــی — خـوێڕی دەرمـاڵاَن وەك سـەگی نـانی

چەكچنیی خوێڕی کەس وە خۆ نەوگ — سـفڵە و زیانــەهار لای دەوار کــەوتگ

شـلەی ڕانگـری بـەدخۆی بەدعەمــەڵ — کوڵــەی کرمــەژن عاشــق وە شــەخەڵ

ئیـسە هـاتگن پـشت لـە پـشت لـە سـەر — خۆت کـەر باوکت کـەر باپیرەت هـەر کـەر

یەك لە دوای یەك جاشەكەر بووگن ئیسە كەی لە وەزع كەری درەچووگن
شەلە و زالواو نەحیەی نەورۆڵە بینیم لە دایكت ئەی توخمە زۆڵە
باوكت جە داخی بەندە هەڕای كرد دەرچوو تا لە موڵك حەسەن ئاوا مرد
تووخوا یا شێخ مەگرە بەهانە من جە ئەوڕەحمان كەمتەر مەزانە
بۆچی ئەوبۆ وا مانگی ئەنعامێ با وجوود وە قەد كەرێ نازانێ
بۆچی من ئەوم بەلاَی ناهارم ترێشقە و تەرزەی هەوری بەهارم
برووسكەی هەجووم ئەر بدا لە كێ ئەیكات وە ئاوی زەردی گەلاَمێو

ئەم پارچە شیعرەی میرزائەولقادر بۆ ئەوڕەحمان ناوێك نووسراوە. لە رووی دەستخەتی كاك ئەنوەری مستۆفی نووسیومەتەوە.

### ئیمشەو چەنی دڵ

ئیمشەو چەنی دڵ دێوانەی بەدخۆ هەر داوامان كەرد تا بە وەخت رۆ
جە گوناو تەقسیر جە بەدڕەفتاری جە كەردەی خەلاف شەیتەنەتباری
جە كارخانەی شەڕ بارخانەی سەنگی جە مایەی شەیتان وە پای فەرەنگی
واتم دڵە دەك فەتاربای ورد ورد دۆزەخت یەكجار پەی وێت خەرید كەرد
نگاكەر وە كار چێشت كەر بە وێت (كرام‌الكاتب) حەیران مەندەن لێت
قابز پەرێ قەبز رۆحت بێزارەن جەو بۆنە عومرت یەند پایەدارەن
هەر سەرزەمینێ پات نیان وە سەر گیاش نەڕەستەن تا یەوم‌المحشەر
گڵكۆ جە داخت فەریادش بەرزەن ناڵەی نەفرینش وە هەزارتەرزەن

مەواچۆ یا حەی کەرەش ئاوارە    نەبوون وە مەنزڵ ئەو بەدکردارە
نەکیرین جە تاو عوسیانباری تۆ    مەلەرزان چوون تولّ شەوان تا بەرۆ
ئەر پەرسان سەوقات چێشت ئاوەردەن    پەیرەویی فەرمان ئەمر کێت کەردەن
تۆ نە خەیرت بۆ نەزەڕەی سەواب    مەبۆ جەو دەم دا چێش بدەی جەواب
جەو یانەی تاریك تەنگ بێدەردا    مەر هەر سەنگ سەرد بدەی وە سەردا
نامەی ئەعماڵت تەمام بیەن پەڕ    جە سەر تا دامان مەرقوومەن جە شەڕ
گشت جە بەدکاریت مەدۆ گەواهی    سفیدیش نیەن غەیر جە سیاهی
مەحشەر مەغلۆبەی گوناباریتەن    سەراسیمەی دەرد شەرمەساریتەن
میزان جە کسرەت عوسیانت ماتەن    غەرق سەرزەمین رووی عەرەساتەن
تاوانت شەشد ەر نەجاتت بەستەن    سەقف و سیراتش وە هەم شکەستەن
دۆزەخ مونتەزر واڵەی لواتەن    وەیلش تاسەکار پابۆس پاتەن
ئایر داخ بەردەی حیلە باریتەن    مالك مات نەفس نەمرودساریتەن
سا چێشەن تەکبیر هەی خاك وەسەر    جای گوریز نیەن چۆن مەشی وەبەر
مەکۆگەی خەیاڵ شەرارەی وەس واس    مەنزڵگای خسووس خێڵ ئەلخەناس
کام سوجدەی خیلاف نەوەردت بەردت    کام غەیرەشەرعی نەکەردت کەردت
پەنجە وەکام هوون نەڕەشتت رەشتت    مەزەی کام حەرام نەچەشتت چەشتت
میراسە کام شەڕ نەیاوات یاوات    کۆگای کام تاوان نەتاوات تاوات
کام دەرس بی هەنی نەوەندت وەندت    کام تۆم عوسیان نەشەندت شەندت
کام ناسەزا بی نەواتت واتت    هەی حیز هەی لەعین ناست و واتت
سا چۆن مەکێشی بار نەدامەت    پەی مەنزڵگەی سەخت سارای قیامەت
هەرچی تەن کەردەن هەر تۆ کەردەنت    دەین ئەعزا گشت بەی وە گەردەنت
هەرچی سایەی تۆ سەربەرزیش نیەن    سەر ئەفکەندەی قام قیامەت بیەن
گۆشت نە سوحبەت کەردە گرتە گۆش    جە راز مەحرەم بیەنی فەرامۆش
چەمت قەراردا پەی دیای نەزەر    پەی وێل هاج بیەن ئیسەر و ئەوسەر
لێوت وە لوقمەی حەرام کەردەن فێر    نە جە بەدی لاڵ نە جە خۆراك تێر
زبان جە غەیبەت لەهو و لەعب نۆش    مودەتێ دنیات بیەن فەرامۆش

موداراش نیەن لادی یەك ساعەت        بەلاّم لالّەنی پەی ورد و تاعەت
گەردەن دایم کەچ چوون نمەكخارە        بیەن وە پەرچین نەفس ئەمارە
دەس پەرێ عسیان کەردەنت عاسی        دەروازەن پەی شەڕ کۆتان پەی خاسی
جە کار شەیتان دەس ئەندەر کارەن        (واجب العزاب دار القرارن)
پا دایم بیەن وە پای عەیاران        پەی سەودای ناباو بەدی جە شاران
جە هەر کۆ ناهەق پەیرەویت کەردەن        هەرگیز نەڕای راس گوزەر نەکەردەن
سەرتاپای جەسەد گشت وە کار تۆ        غەرقەن نە دەریای عوسیانی بێشۆ
دلّە وە چێش دان تۆ وێت دەلاّلەت        دلّە چێش مەکەی تۆ جە خەجالّەت
دلّە رۆی دیوان سەر ئەفکەندەنی        دلّە شەرمەسار خوا و بەندەنی
دلّە رای نەجات گوشادیت بەندەن        دلّە جای رجای کەست نەمەندەن
دلّە تاف جۆش جوانیت ویەرد        دلّە پیریت رای گشت مەینەت تەی کەرد
سکەی سیاهی گێلاّوە کافور        شاچراغ عەین سفر بی جە نوور
جە تانەی پیری عەیبش ئاوەردەن        پەنای مەعیوبی وە عەینەك بەردەن
رووخسار گولّپەڕ وێنەی گولّزاران        بیەن وە رووی سەنگ سیای هەواران
قەتارەی دندان چوون دانەی گەوهەر        ریشەش جە پای تەخت گشت ئاماوە بەر
دەم جە دەم بازی یاران نەبیەن کەم        چەفت و چۆلّ و لار چوون چین بادەم
بالاّی ئەلفوار چوون نەمام نۆ        چەم دان چەنی خەم وێنەی چەمی چۆ
بەڎەن جە ئاوای شادی بیەن چۆلّ        نە زەوق دەروون نە زۆر زەنگۆلّ
نە شێوەی وەرین نەعەیش جاران        نە مەیل دلّبەر نە یاد یاران
نەمەندەن جەلام کافیەن تاوان        عومرم وە هەنگام سەرمۆلّە یاوان
بەدبەختی دیەن دلّە پارەبای        جە قەلاّی وێران تەن ئاوارەبای
دنیات داوەسەر وە حیلەبازی        توخوا تۆ وە کام نیکی مەنازی
وەس کەر خەیالاّت خام وەسواسە        ساتێ خوای وێت وە حەق بناسە
ویەردە و ئەفعال دەرد ویەردەت        جە تەندەی پڕدام ناپاکی کەردەت
نە هەرکۆ دنیان تۆ جە لاش یاری        نە هەر کۆ دینەن تۆ جێش بێزاری
دنیات وێنەی دین یەکسەر جێدوورەن        دینت چوون یانەی دنیات خاپوورەن

دەینــت پــەرێ دیــن زۆرش ئــاوەردەن	دین جە زوڵم دەین فەرامۆش کەردەن
دینت کەرد وە کا دەین وە بەرزی کۆ	دڵــەی دەیــن دیــن وە گــەردنت بــۆ
بــەو دەس و ئــیخلاس وە زوی پاکــەوە	روکــەر وەلای دیــن شــای لەولاکــەوە
چــوون ئــەو شــفاخوای گونابارانــەن	حــــەکیم حــــازق دەردەدارانــــەن
ســالار دیــوان مەحــشەر هــەم وێــشەن	مەحبوب مەخسوس شای بێئەندێشەن
بــەڵکوم تالیقــەی عــەفوت بــاوەرۆ	وە زمــرەی ئۆمــەت قبوڵــت کــەرۆ
هەرچەند تۆکەمفام ئەبڵە و شێتەنی	مــەئیوس کــردار کــەردەی وێتــەنی
(قــادر) رەحمــەتش بــێحــەد شمــارەن	غــەفورەن رەحــیم ئامورزگــارەن

ئـەم پارچـە شـیعرەم لـە رووی دەسـتخـەتی ئـەفوایی نوسـیومەتەوە لـە سـەرەتاوە نووسراوە (میراز عبدالقادر است) لە کۆتاییشدا نووسراوە (تمت شە سنە ۱۳۴۵)

## ئیمشەو قیبلەکەم

ئیمشەو قیبەلکەم لە من کەفتەن دوور	دووربۆ لە دیدەش دیدەم بیەن کوور
ئیمــشەو نــازارم لــە مــن پێــوارە	عــەقڵ و فــامی مــن بیــەن ئــاوارە
ئیمــشەو قیبلەکــەم دنیــا و دینەکــەم	مــەحبوب شــیرین مەهجەبینەکــەم
بــالای زەریفــش لــێم نادیــارەن	کــۆرەی دەرونم شــەرارەی نــارەن
ئیمــشەو مەواچــی عەزاداریمــەن	جــە داخ دڵبــەر دەرد کاریمــەن
ئیمــشەو شــەو نیــەن زاج دەیجــورەن	جـە دووری بـالات دیـدەم بـێنـورەن
کاشــکای نەکــەردام ئــەی ئاشــنایی	وەیتــەور نەچەشــتام مــەزەی جیــایی
کاش وەرۆی ئەزەڵ تـۆم نـەدیا وە چـەم	تا وەیتەور یەقیر نەبیام چەنی خـەم
یــاخوا کــەس بــادەی هیجــران نەنۆشــۆ	جــەرگش وە ئــایر حیرمــان نەجۆشــۆ
ئیمــشەو وادەی مــەرگ دەرد کاریمــەن	بــێ ســەبر و بــێتــاو بــێقەراریمــەن
ئیمـشەو لـە دیـدەم ئەسـرین وە تـاوەن	ئەســرین دیــدەم ماچــی لافــاوەن
ئیمشەویە پەی چێش خەولێم تەوا سا	پەی ێش عەقڵ و هۆش لە من هەرا سا

## بەڵێ ئەی قادر(١)

| | |
|---|---|
| بـەڵێ ئـەی قـادر بـێئـەقڵی کـەمفـام | لێوەی هـەرزەگۆ ئەبڵـەی خـەیاڵ خـام |
| *مەر تەنگت کێشان یا قەلبت مـەردەن | نـوری حـەزرەتت فـەرامۆش کـەردەن |
| *بزانـە جـە کـۆن ئـاخر جـاش کامـەن | ئـەوەڵ مـداراش نـە کـام مەقامـەن |
| *چـکۆ مـەگێڵۆ بـە دڵخـوازی دڵ | تەشـریفش جـە کـۆ مـەگێرۆ مـەنزڵ |
| هەر ئەو شەو ئەوان تەشریف مەبەردن | ئـیرادەی مـەنزڵ غـار سـەور کـەردەن |
| مار وە ئەمر حەرق سەر ئـاورد وە بـەر | سـڵاو کـەرد واتـش یـا خەیرلبەشـەر |
| چەند قەرنەن ئەی غار ئـەی جاگـە جامـەن | ئـەی سـۆراخ سـەنگ زەیـد و ماوامـەن |
| ئـارەزووی روخـسار پڕنـووری تـۆم بـی | مـەیلم شـەرەفیاب حـوزوور تـۆ بـی |
| دیـم ئەبوبـەکر راگـەش لـێم بەسـتەن | بـە خـوذا خـۆ مـن ئـەوم نەگەسـتەن |
| وەرووی ئـیرادەت پابوسـیم کـەردەن | پەوکەتەی فەورەن دەرسات نەمـەردەن |
| ئـەر وە غـەیزەوە مـەدام پاشـەوە | نمـەیاوا کەسـێ وە هاناشـەوە |
| قەسەم هـەر بەوکـەس بێخـورد و بێخـاو | ئـەعزاش گـرد مـەبی وە یـەك قـەترەی ئـاو |
| حـەزرەت فـەرماوا بـشۆ وە جـای وێـت | خواوەنـد هـەرگیز فرسـەت نـەذۆ پێـت |

(١) مامۆستا مەولەوی ئەم تاکەدێڕەی خوارەوە دەنوسێ بـۆ مـیراز ئـەولقاذری پـاوەیی کە ئەویش بەم پارچە شیعرە جوابی ئەداتەوە پاش ئەوە مەولەوی بۆی دەرئەکەوێ کە میرزائەولقاذر شاعیرێکی ناسك خەیاڵ و بیرمەنـدە ئەگەرچـی مەولـەوی لـە رووی تەمەنەوە لە میرزا گەورەتر دەبـێ هـەر بـەم بۆنەیـەوە گەلاڵـەی دۆسـایەتی لـە گەڵـدا دەرێژێ و چەندجارێ سەردانی یەك دەکەن. ئەوەش تاکە دێڕەکەیە:

سای کەمەر وەشەن ئەر مارش نەبۆ      دۆسی خاست بۆ و بەدکارش نەبۆ

(٢) *ئەم چەند دێڕەی لە رەولەتوسەفاکەشیدا هەیە.

تەپەدووی دووکەڵ

تەپەدووی دووکەڵ دووخانەی دەردم      کزەی رەشەبای هەناس سەردم

پۆشان دەشت و دەر هەوارگەی دەروون      هەم نادیارەن دڵەی پڕ جە هوون

مەر هەر یاد تۆ هەی ئاوات وەستەم      بزانۆ جە کۆن دڵەی دەربەستەم

بەیۆ چوون شەماڵ رۆح ئەفزای کاوان      یا وێنەی نەسیم سوب نە شەتاوان

سەلاح هەر ئێدەن وە یادم باری      یادت یادم بۆ پەی یادگاری

روو بنیەی وە رووی سیای پوڕ جەنگەڵ      وێران کەر وە باڵ دووخانەی دووکەڵ

دیسان یانەی دڵ جە تۆز و تەمدا      جاڕو دەر نەجای دووخانەی خەمدا

وەرنە تا مەحشەر دڵ زامش وەردەن      نادیار دەم، دووخانەی دەروون

فدای یادت بام سا کۆن کەی تا کەی      دڵ بی وە کوورە، با یاد تۆ بەی

یادم کەر وە یاد ویەردەی جاران      وەسۆز سەودای شەرت و شۆنداران

ئەر سەد کەوە یاد قەدیمت شادم      توو خوا با نەشۆ یادت جە یادم

شەوان تا وە ڕۆ یادم جە لاتەن      دەك بە رەحمەت بۆ مەعدوومی واتەن

(چ حاجەتەن دەس پەی قەڵەم بەروون)      یادم نمەشی چەنیت یاد کەروون

بەڵام جەلای دڵ کۆی مەوبەت شادت      زەحمەت مەندە بۆ یادم جە یادت

یادت بۆ وەخەیر شای شیرینرازان      ئەی دەرمان دەرد گشت مارانگازان

چەوساوە باڵات جە لام پێوارەن      رۆشنی دیدەم تەمامی تارەن

فیراقت فەرقم مەڕدەن وە هەمدا      دووریت دڵکێشان وەلیتەی خەمدا

ئەر پەرسی ئازیز چوون جاران جاریٚ    یانیٚ های دووریت نەکەردەن کاریٚ

زیندەو سلاٚمەت نەی دنیای بیٚپۆ    مەگێلاٚن وە شۆن عەشق بالاٚی تۆ

تنیان رشتەی تار تای نائوومێدی    حازەر کەر پەرێم کالاٚی سفیدی

هەر کاتیٚ زانای خالٚ فل فل دانە    نەفەس پەرواز کەرد نە قەفەسخانە

پەژاران شەو خەیالاٚن رۆ    دەرد بیٚ دەرمان ئێش دووری تۆ

جەور و جەفا و خەم، باری نەدامەت    گرد کەوت ئەو دیوان سارای قیامەت

دەخیل تا ئەروام کەمیٚ باقیەن    تا دەور چەپگەرد بادە و ساقیەن

یەك تار جەو کەلاٚف سیای ئەشەد بۆ    پاسەبان دەور شەمامە و لیمۆ

بکیانە ئامان پەی زام کاریم    پەی وەیویر گەرم زایەڵە و زاریم

بەو شەرتە رەقیب نەدەروت بازی    بەڵکەم بمانۆ پەی تیرئەندازی

زیاتر لە رووی کتێبەکەی نووسراوەتەوە.

### جامەدۆزان

جامەدۆزان کەرد جامەدۆزان کەرد    یەك رۆ لەیل وە ناز جامەدۆزان کەرد

یاد هەوارگەی قەدێم هۆزان کەرد    بەخیەدۆزی بەرگ دڵ ئەفرۆزان کەرد

خەیاڵش جە خەم تەمام کەرد خاڵیٚ    بڕشت کەرد کالاٚی ئالاٚی متقاڵی

کەلاٚفی حەی تار ئەژدەر وست نە پشت    کلکەوانەی لاڵ کەردش نە ئەنگوشت

پەی دەفع خەتەر نیش مەودای خار    تا پەنجەش وە خەم نەکێشۆ ئازار

وەتای خەیاتەی خام ناو شاران    چەنی رشتەی دڵ خاتر پڕخاران

وادا وە هەمدا بە لارە و لەنجە    سەر مەودای دەرزی گرت وە سەرپەنجە

دڵ وە خەیاڵات چەم وە نازەوە
لەب و شەکەرخەند ڕێزی ڕازەوە

دەس وە دروومان بەخیە دۆزەوە
پێشانی بەو شەوق شەم ئەفرۆزەوە

چوون باش خەیاتان ئۆسای تەتاری
کەوت وەسەودای نەقش، دا و گوڵکاری

هەر تەقەڵ سەدناز نەزاکەت مەکەرد
هەر نازی سەدهۆش جە ئاذەم مەبەرد

بەلاّم ئەی یاران دۆسان دڵداران
عەجەب کارێ دیم جە ڕۆزگاران

جەو دەمدا دوڵبەر دروومان مەکەرد
ناگا ئەو دەرزی شکیا و شکەست وەرد

ڕێزە ڕێزە بی ڕێزا وە هەمدا
شی نەراگەی مەوت موڵك عەدەمدا

چوون پێشەی ڕەمیم قەذیم مەزاران
پەخش بی چەنی خاك خاشاك خاران

لەیلێ هەم خەلێ خەمان بەرد وە دڵ
ئایینەی ڕەنگش قرمز بی چوون گوڵ

ساتێ پەشێو بی شای عەرعەر قامەت
جەودما واتش هەر وێم سەلاّمەت

دەس بەرد دەرزێ هەنی بەر ئاوەرد
دیسان جە نۆ مەیل وە دروومان کەرد

منیچ وێنەی قەیس دێوانەی سالاّن
جەو دەرزی بێگیان پەرسام هەوالآن

هۆر گرتم جە خاك واتم ئەی بێمەیل
شکست دای بە وێت عاجزی وە لەیل

تۆ خۆ پۆلاّی سەخت سەرجۆش خار بیت
ڕەواج بازار پای سەوزەوار بیت

ئازیز بەو پەنجەی بلوور بافەوە
بەو سیم ئەنگوشت نەرم و سافەوە

کێ زۆر پەنجەش زەڕەی پێیاوان
وێت وێنەی فەرهاد کوشت وە بێتاوان

کێ دیەن بلوور پۆلاّش مەڕدە بۆ
کێ دیەن شەکەر تەوەن هەڕدە بۆ

ئیسە تا مەحشەر بناڵە هالاّ
مەحروم بیت جە دین ئەو بەژن و بالاّ

دەرزی ئێذ شنەفت کێشا ئاهی سەرد
لۆرە هەناسەش جە گەردوون ویەرد

واتش ئەی مەجنوون سادار سەرمەشق
بەدبەختەر جە من تۆ چە سەودای عەشق

تۆ چێش مەزانی زیندەگیم چیوەر
چ تەور ویاران جە لای ئەو دوڵبەر

هەتا چەنی بەخت سەعادەت یار بیم
جە لای ئەو نازار دایم نازار بیم

هەرچی قوماشان کالاّی ئالاّش بی
پارچەی ئەلوانان ئالاّی بالاّش بی

یەکسەر گشت وە من دروومان مەکەرد
چوون مەیلش چەنیم نەکەردەبێ سەرد

گاگا وەشاذی من مەدا وە فەرق
چەنی ستاران دایم مەذام بەرق

پەند تأسیر سۆز مەیلم یاوا پێش
من کەرد وە مەحرەم یەخەی جامەی وێش

چەند ساڵ یەخەی لەیل جەی وەر جام بیەن     سینەی سیمینش مەنزڵگام بیەن
شەوقم وە دڵواز شادیم وەکۆ بی     دەماخم پەرداخ عەتر لیمۆ بی
هەرگیز نەدام رای نەسیم سەحەر     جەو یەخەی کەتان بکەرۆ گوزەر
ئینە چەند وەختەن غەزەب گرتەن لێم     مەیل جارانش هیچ نەمەندەن پێم
نە تۆی دەرزیدان مەحبووسم کەردەن     سەد جار واستەنم ئاوات پەی مەردەن
دایم جەو زیندان سیای مەینەت کەیل     نە لەیل مەوینام نە نیمنیگای لەیل
بااللە ئەر وە حاڵ دەردم بزانی     مەردەیم وەشتەرەن جەی زیندەگانی
هەنی جەی فێشتەر لێم مەدەر تانە     نەداروون تاقەت ئەو بەندیخانە
تۆ هەم وە باڵاش خەیلێ مەنازی     رۆیە هەن ئەو من ئاوات بوازی
ئەر من پۆڵا بیم سەنگم مەشکاوا     تا ئاخر حاڵم وەی جاگە یاوا
تۆ خۆ گۆشت و کەف سەرتاپات هونەن     پەی سزا و مەینەت جەستەت زەبونەن
ئەو رۆ فەنا بای جە ئێش زامەت     چەنی تۆیچ ماچۆ هەر ویم سەلامەت
هەر چەند جە لای لەیل بوڵەند پایەنی     عاقیبەت چوون من کۆتا مایەنی
قاذر یە دامەن تۆ پەی ویت تەنەدەن     رازان دەرزی گشت پەرێت پەنەدەن
وێت وست نە حەڵقەی تۆڕ دام مەینەت     بێسوودەن ئیخلاس یاری بێ بەینەت

**لە کۆتایی ئەم پارچەشدا ئاوا نووسراوە:**

**«تمت شد از دست حقیر عبدالحسین تاریخ یوم پنج شنبه شهر مولود ۱۳۲۷»**

جوانی وەشەن، جوانی وەشەن     میرزام شەوق و زەوق جوانی وەشەن
سوخەن رازنای مەرجانی وەشەن     ئیعتیبار مووی قەترانی وەشەن
شنەوای شنۆی سەمع و گۆش وەشەن     ئاداب و تەعلیم عەقڵ و هۆش وەشەن
باڵا باڵای بەرز چوون شاتووڵ وەشەن     جاهێڵی و شەرت مشتو پوڵ وەشەن
سەیر بانەوبان بەرگ و بۆ وەشەن     رەفیق گیان و من گیانو تۆ وەشەن
سوب سەیر راگەی سەرکانی وەشەن     نیگا پەی رەقیب نیهانی وەشەن

چەنی هامفەردان ئێواران وەشەن    سەرگۆشی نەپای دیواران وەشەن
تەماشای گەردەن ئاهووی بەڕ وەشەن    تکەی قەترەی ئاو زوڵف تەڕ وەشەن
ئیشارەی ئەبرۆی مەیل دۆس وەشەن    نەڕای دۆس خاس بەلاٚ و کۆس وەشەن
بەین بەستەیی نۆ چەنی لەیل وەشەن    شەرت دڵداری وەفا و مەیل وەشەن
گلەی دەم وە جەنگ ڕێزەی راز وەشەن    شەقەی ماچوو مووچ غەمزە و ناز وەشەن
دادەی دانای پاك داوەری وەشەن    حەراڵی حاڵزان هامسەری وەشەن
شەوان تا وە رۆ بۆ وە بۆش وەشەن    تارۆ بێ خەیاڵ عەیش و نۆش وەشەن
چەنی رەفێقان دیدەنی وەشەن    شەوان تەقەی دەمنشینی وەشەن
شیرینی و شەربەت شەوبازی وەشەن    گوڵ دەستەی جوراب دڵوازی وەشەن
دەس‌چنی مەچۆی هامدەردان وەشەن    زەوق زانای نۆ هامفەردان وەشەن
سەدای خۆش‌خانان نەوای نەی وەشەن    ناڵەی عاشقان پەیاپەی وەشەن
دەنگ نۆشاذی سەدای ساز وەشەن    رەقس رەقاسان بازی باز وەشەن
رەفت رەژبەلەك لۆنگ وە کۆڵ وەشەن    شەقەی پەنجەی کەوش پای دەهۆڵ وەشەن
خەشم و نەزاکەت لەنجەی یار وەشەن    خەندەی مەیل گەرم خاتردار وەشەن
شاخەی شریخەی گاوە کۆ وەشەن    سەدای هەی ئازیز چۆونی تۆ وەشەن
حەقیقەت زمسان تفاق بۆ وەشەن    نە هەرجا مێنگەی مەزاق بۆ وەشەن
راحەتی و ئاهەنگ بێکاری وەشەن    زەم زەمەی لای خوان بوخاری وەشەن
شێوەی پەردەی شەرم نیگاران وەشەن    فەزای فەسڵ وەخت وەهاران وەشەن
سەیر کەشوو کۆ سەر دیار وەشەن    رەنگ سار و دەشت میرغوزار وەشەن
شکۆفەی عەجەب سەرخامان وەشەن    بۆی وەنەوشەی پای نەمامان وەشەن
هەناسەی شەماڵ بۆی گولاٚن وەشەن    زایەڵە و ئەفغان بولبولاٚن وەشەن
سەفای هەمیشەی ئێلاٚخان وەشەن    سەیاذی و کۆگەرد سەرشاخان وەشەن
پارێزگای پای رێز کەڵڕەمان وەشەن    نالەی رەعدئاسای ماردومان وەشەن
عەتر گوڵ سۆسەن شەوبۆی هەرد وەشەن    جاسوزگەی نەچیر بەردەوبەرد وەشەن
تای بەڕەزای تاش بۆی چنوور وەشەن    سەیر سەربەرزان دووراودوور وەشەن
نە دامان کۆ سیاماڵ وەشەن    سەیر مەحبووبان زوڵف و خاڵ وەشەن

جەرگ و بەز نەپای موغاران وەشەن          چەمو خەم چەنی خەمباران وەشەن
هەر کەس ئاخینەن بواچۆ ئاخ وەشەن          سەیر چەم و چەم باخ ئەو باخ وەشەن
تەلمیتبار وەشەن سەرهەوار وەشەن          پای نسار وەشەن سای دەوار وەشەن
تەماشای سەوزەی چەمەندان وەشەن          ئیسراحەت نەپای سەهەندان وەشەن
شەرارەی هامن گەرمی مەیل وەشەن          داران گشت جە بار میوەی کەیل وەشەن
سای هەر سەهەندێ مەنزڵەن وەشەن          جای هەر پەسەندێ جای دڵەن وەشەن
جە هامن ویەرد نۆپاییز وەشەن          وادەی نۆسوەیل گەڵاڕێز وەشەن
زەردی رەنگزەرد نەداران وەشەن          چەمیای بار خەم چناران وەشەن
شاخ تاف ساف قەڵوەزان وەشەن          ئەلوەدای خەزان پای رێزان وەشەن
کۆچ کەردەی ئەحشام خێڵ ئەو خوار وەشەن          پەشێوی پەرداخ شەدەلار وەشەن
تەماشای قەتار مەی و کۆڕ وەشەن          نیمەشەو هاڕەی زەنگ و قۆڕ وەشەن
سەیاحیو سەفای بازاران وەشەن          زندەگی و دەوڵەت جە شاران وەشەن
نە بەزم شادی نەوای نەی وەشەن          ناڵەی عاشقان جامی مەی وەشەن
سەیر پاوەشار ماڵە و ماڵ وەشەن          جە پاوە هەم گەشت کۆیمەکاڵ وەشەن
میرزام هەرچیم وات یە گشت هەر وەشەن          جەی گشت وەشیدا قاذر بێبەشەن
نە مەیل وەهار نە سەحرا و کەشم          هەر وە لوتف حەق زەرەی دڵ وەشم

ئەم پارچەیە لە رووی دەستخەتی ئەفوایی نووسراوەتەوە

### خانا عەرزم هەن

خانا عەرزم هەن گرانەن دەردم          تووخوا گوێ بگرە نەختێ لە فەردم
ئەوەڵ خواوەند بدۆ دەوامت          چاوی بەد دوورکات لە زۆر و سامت
شابالی حوکمت دایم دراز بۆ          رەواجی بەغدا و شام و شیراز بۆ
سانیەن بەندە دەرون پڕ لە رەنج          ئەوا عومرم چو بۆ پەنجا و پەنج
تا ئیستە زوڵمم هیچ لێ نەچووگە          لە لای کوڵ عالەم حورمەتم بووگە
ئیستە رویمە ژێر جامەی یەکجاری          گشت رۆژێ وە زۆر ئەموەن بێگاری

وەك ئیتاعــەكێش كلیــسا و كەنــشت
وا كێشم ئەكەن بۆ كۆرەخانـەی خـشت

وە ریـشی چـەرمگ جەسـتەی ناتـەوان
ئـەموەن بـۆ بـەردەس ئۆسای كرماشـان

ئۆساحوســەین خـۆی پیـاگێكی خاسـە
چــوونكە عارفــە و عــارف شناســە

بــەلاّم یــەكێ هــەس نــاوی كەریمــە
بــێشـك نــەبیرەی تــوخمی رەجیمــە

هــەم كــاولّیزادە هــەم كۆنــە حیــزە
وەلاّتـــی داگـــە لـــە بـــەر نـــەقیزە

ســاتێ ســەد دەفعــە هــەی میـرزا دێـرە
هــەی خــەڕگ بـارە بـچۆ خـاك بێـرە

رۆژێ تـــا غـــروب گیـــانی كێـــشاگم
كەســـێ ناپرســـێ مـــاگم نـــەماگم

نـــەخوذا قبـــولّ نـــە رەســـولّ رازی
نـە فتـوای شـەرعەن نـە حـوكمی قـازی

نــە خــۆ مــستۆفی وە مــن ئــەكا كــار
خۆنــە كــەدخودا ئــەمنێری بــۆ دار

ئیـستدعام ئێـذەن مـن دەركـە لـە كـار
تــا دۆعــای خێــرت بكــەم هــەزارجار

لە رووی دەستخەتی كاك حەمەی خالدی نووسراوەتەوە

### خانم خەندەشەن

خـانم خەندەشـەن، خـانم خەندەشـەن
چوون غونـچەی نـەوخێز دایـم خەندەشـەن

خـــەرامان چـــین سەرئەفكەندەشـــەن
سەد كەس چوون خورشید خاوەر بەندەشـەن

عەرعــەر جــە باخـان حـەیران مەندەشـەن
چنوور بەنـد زلّـف شـەمالّ شەندەشـەن

خەجالّــەتش كــەرد خــۆر وە هــەواوە
فـــەزا هـــا بـــەلای خورشـــید نمـــاوە

ئیبتیـــدای جلـــووس نەوجوانیـــشەن
ئینتیهـــای ئـــاداب نوكتەدانیـــشەن
ئـــاهوی نەساســـلّ، مـــشك بـــۆ نافـــەن
نـــەمام نـــۆخێز تـــولّ پـــای تافـــەن

(محبــوب القلــوب) بێگانــه و خێــشەن
پــەنای غــەریبان گــەڎا و دەروێــشەن
چــوون کــەبك کۆســار مەشــۆ وەراوە
فــەزا هــا بــە لای خورشــید نمــاوە

شــیرین ئەرمــەن خزمــەتکارشــەن
لــــەیلی عــــامری شەرمەسارشـــەن
تەرســای فــەرەنگی ئاوپاشــی راشــەن
هومــەیلای پــەری پــابۆس پاشــەن
شــەوبۆ ئــارەزوی عــەتر شەوبۆشــەن
لیمــۆ هــەم زایــف زەردە لیمۆشــەن
ئــاهوو خەجاڵــەت نیگــای نازشــەن
تــووتی شــەرمەندەی رێــزەی رازشــەن
رەفــێقش نیــەن جــەرووی دنیــاوە
فــەزا هــا بــە لای خورشــید نمــاوە

شــای میناگــەردەن بوڵەنــد دەماخــەن
شــاهان نــەزەنجیر زوڵفــش دووســاخەن
جــە کــۆی بێــستوون فــەرهاڎ شــەردەوە
نــیمنیگــاش مــەجنوون داوە گــەردەوە
سەنعان پەی شێوەش نـە شاران وێڵەن
بــارام جـــەداخش نمـــەد وە پێڵـــەن
کــان کــۆی کــەرەم خەزانــەی لاڵــەن
مەلـەك مەعریفـەت دەریـای کەماڵـەن
نــازاران بیــان تیــپ تیــپ جــە پــاوە
فـــەزا هابـــەلای خورشـــید نمـــاوە

نــەمام نــەورەس ئــەو ترمــە پۆشــەن
شــای شــیرین رازان شــەکەر فرۆشــەن

گوڵ بۆی گۆڵ دەهەن هەم گوڵ جەبینەن
پەروەردەی ئێلاخ گوڵزار چینەن

ئەو تەرز تەڕلان شۆخ شابازەن
ساحیب عیشوە و لەنج کرشمە و نازەن
شەهنشای ئیقلیم خاڵخاسان وێشەن
شەفای دەرد دڵ بیماران پێشەن
سۆفی پەیش نەڕای مەسجد گێلاوە
فەزا ها بەلای خورشید نماوە

نەقڵش چوون شەکەر نوقڵ شارانەن
خەندەش خەلاسی خەفەت بارانەن
گوڵ جە عەشق ئەو دایم تاسەشەن
گولاو ئینتزار بۆی هەناسەشەن
نوور لەقای هەق وە چارەش وەشتەن
خونچەی زیبای باخ دیبای بەهەشتەن
وەختێ جە روی ناز مەڎیۆ دماوە
فەزا ها بەلای خورشید نماوە

تاریخ عومرش نە پەنج و هەشتەن
دایم چوون تاوس مەیلش گوڵگەشتەن
بێخەبەر جە دەرد وەسواسەی دڵەن
لاقەید جە سۆزان ناڵەی بوڵبوڵەن
هەلای وە هیجران گیرش نەوەردەن
پیاڵەی عەشقش لەبچەش نەکەردەن
دیڎەی وێش نەڎیەن وە دیڎەی یاران
نەکەردەنش سەیر مەحاڵ و شاران
وەرنە مەڎاش عام گشت وە فەناوە
فەزا ها بە لای خورشید نماوە

پیشانیش پرشەی شەمس پڕنوورەن
نیشانەی نەزەر تەجەلای توورەن
مەلائیك حەیران تاق ئەبرۆشەن
گۆشوارەی گەوهەر تەڵا نە گۆشەن
دیڎە دیڎەی جەیر خۆتەن پەروەردەن
نیگا چوون شاباز نەچیر گوم کەردەن
موژەش چوون نەیجول خەدەنگ خارەن
تا وە رۆی مەحشەر زامش ئەوگارەن
دڵبەران نیشان هەر بەو تەماوە
فەزا ها بەلای خورشید نماوە

گۆنا شەکەرسێف خامەی خانسارەن
پا لاڵ مەعدەن مینای بازارەن
دەهەن گوڵ غونچەی دادەی داوەرەن
یا چشمەی حەیات دانەی گەوهەرەن
لەب دورج یاقوت دڎان چوون گەوهەر
نگین ئەنگوشت، دارا و ئەسکەندەر
چوون شیرین نە پشت پەنجەرەی شاوە
فەزا ها بەلای خورشید نماوە

قاش قەوس قەشەنگ یاقووت بێگەرد
شۆخ شیرین حاڵ چاڵ تینی زەرد
گەردەن چوون بلوور سفیدی بێ پەی
یا شیشەی شەربەت کە یانان کەی
ئەر یەك قەترەی ئاو مەیل کەرۆ چوون حوور
نەسای گەردەنش دیارەن جە دوور
سینەش سفید بەت لاچین ئاوان
پا پەڕ قووی نازك نەرم شەتاوان
حاجیان کەردەن تەرك رای کاوە
فەزا ها بەلای خورشید نماوە

خــەرامش مەرهــەم ئــێش زامەتــەن
قامــــەتش فــــەزای رۆی قیامەتـــەن
نـــازار نـــۆ تـــوولْ یانـــەی باوانـــەن
بـــانوی موحتـــەرەم ســـەرکار خانـــەن
موبـــارەك قـــەدەم مەلـــەك مـــەنزەرەن
رەژیـــدەی قـــودرەت  دانـــای داوەرەن
ئـــەو کـــالاّ لایـــەق وە بـــالاّی خانـــەن
ئێدْ چوون بلقەیسەن ئـەو سولەیمانەن

بنیـــشان وە هـــەم  وە ئیـــستیغناوە
فـــەزا هـــا بـــەلای خورشـــید نمـــاوە

خولاســـە خـــانم نـــەمام نـــەو بـــەر
هـیچ عـەیبش نیـەن جـە پـا تـا وەسـەر
یاشـا تـا دنیـان بولْەنـد ئیقبـالْ بـای
هەر زەڕە شیرین ساحیب جـەمالْ بـای
(قاذر) چوون موخلیس قەذیم ئیخلاسـەن
بـافتی مەرحەمـەت خـەلاّتێ خاسـەن

## خەمبارم ئیمشەو

خەمبارم ئیمشەو خەمبارم ئیمشەو    هانا هامسەران خەمبارم ئیمشەو
جە ئێش زامان ئەوگارم ئیمشەو    گرفتار دەرد ناخارم ئیمشەو
سەرتاپا چوون کۆی زوخاڵم ئیمشەو    مەر حەق بزانۆ وە حاڵم ئیمشەو
خەمزەدەی خەمگین خەم وە کۆم ئیمشەو    جە بەین ئافاق رەنجەڕۆم ئیمشەو
هەر جایە خەمەن نە عاڵەم ئیمشەو    یەکسەر جەم بیەن نە تاڵەم ئیمشەو
ئاهم جە گەردوون ویەردەن ئیمشەو    ناڵەم عالەم گشت کەڕ کەردەن ئیمشەو
ستارەی بەختم بێنوورەن ئیمشەو    بەدرە دووهەفتەم دەیجوورەن ئیمشەو
دەروونم کۆرەی پڕجۆشەن ئیمشەو    شەمع شادی دڵ خامۆشەن ئیمشەو
دڵەی مارانگاز هەم گیرەن ئیمشەو    نە حەڵقەی خەمان زەنجیرەن ئیمشەو
خەیاڵم وە خەم پەڕ کەندەن ئیمشەو    هەردان جە ئاهم گڕسەندەن ئیمشەو
کۆی خەم نە دەروون کۆ بەستم ئیمشەو    گەور کۆ نەبۆ وە جەستەم ئیمشەو
بازار شەوقم خاپوورەن ئیمشەو    بینایی دیدەم بێنوورەن ئیمشەو
دووکان شادیم کەساسەن ئیمشەو    چوون نۆفەیڵ زەهرم نەتاسەن ئیمشەو
غەرق دەریای گێج پەژارەم ئیمشەو    نە سەحرای شادی ئاوارەم ئیمشەو
یارم رەفیقم هەر خەمەن ئیمشەو    دڵ چەنی خەمان ماتەمەن ئیمشەو
بڕیان کالأی خەم وە بالأم ئیمشەو    تا سوب سفید بی هەر نالأم ئیمشەو
خار و خەتەرناك دڵ تەنگم ئیمشەو    تۆز خەم نیشتەن نە رەنگم ئیمشەو
مەجنوون چۆڵگەرد دووجەیلم ئیمشەو    مەئیوس و مەحرووم لای لەیلم ئیمشەو
بەزم ئاهەنگم هەر ئاخەن ئیمشەو    دڵ نە دام خەم د ووساخەن ئیمشەو
چەنی خەیالأت مەدهۆشم ئیمشەو    سەڎای قابزەن نە گۆشم ئیمشەو
یەقین وادەی کۆچ مەردەنەن ئیمشەو    تەشریف وە سای سەنگ بەردەنەن ئیمشەو
حەکیم جە حاڵم غافڵەن ئیمشەو    سەرتاپام وە زووخ کوڵ کوڵەن ئیمشەو
بەڵ وینۆ جەستەی ئەندامم ئیمشەو    بشانۆ مەرهەم وە زامم ئیمشەو
وەرنە بەو دانای دادگەر ئیمشەو    نمیاوۆ گیانم تا سەحەر ئیمشەو
سپای خەم هجووم ئاوەردەن ئیمشەو    ئەساسەی شادیم گشت بەردەن ئیمشەو

